- ناوی کتێب: پاڕانەوە لە ئاو
- نووسەر: جەمال غەمبار
- بابەت: شیعر
- کۆمپیوتەر: طه حمه نوری
- ئۆفسێت: چاپخانەی داناز
- تیراژ: (500) دانه
- ساڵ: **2001**
- شوێن: کوردستان - سلێمانی

**ژمارەی سپاردن:** 97 ی ساڵی 2001 ی وەزارەتی رۆشنبیری دراوەتێ

بۆ:

**باران و (ئەو) کە نەمتوانی بیاننوسمەوە!**

پێشکەشە..

**جەمال غەمبار**
**شام** – 2001

# بەشێك لە ئێوارانی ئیمپراتۆر

*** چونکە، شەو داهات و**
**بەربەرییەکان نەگەیشتن..**
**هێندەش نابێ، هەندێ خەڵك**
**لە سنوورەکانەوە گەیشتوون،**
**ئەوانیش دەڵێن"**
**بەربەرییەکان لەوێ نین..**
**ئەمێستاکە، بێ هاتنی بەربەرییەکان،**
**داخۆ، ئێمە چیمان بەسەردێ؟!**

(کاڤاڤیس)

لە قەسیدەی – بەدەم چاوەڕوانیی بەربەرییەکانەوە –

***ئێوارەکانی ئیمپراتۆر / ئەو ئێوارانەن کە – رەوەز – یان -گـورون – م تێدا ناسی / ئـەو، واتـە – رەوەز – لـە قـەرنی داهـاتووی شـەڕەکانی***

ئیمپراتـۆردا جـەنگاوەرێکی سـەقەت دەبـێ / چـاوی راسـتی لەدەسـت ئەدات و / لەبـەردەم چـرا ماندووەکانـدا / دەقـەکانی شـەڕ بـە مـن دەنووسـێتەوە و / بـەدەم تایفۆئیـدی بیرەوەرییـەکانی خۆیـەوە / دەیانخوات و / پاشان دوا ورتە ورت / لە کوڕە تاقانەکـەی – مەریـەم – قەرزدەکا و کەچی بەپێچەوانەی ئەویشەوە / بـەر لـە کوژانـەوەی مـانگ/ بـەر لـە پێـوەدانی دەرگاکـانی روونـاکیی / لاسـتیکێکی خـەت کوژانەوەم ئەداتێ و / سەرلەنوێ / رووبارێکم پێ پڕ دەکات لە رەسمی ئەو گێلاسانەی / کە بڕوایان بە کەنارە خۆڵەمێشییەکان نەبوو / کەچـی برینەکانی خۆشیان لا جێهێشتن / بەر لە تەواوبوونی دەقەکانی شـەڕ / پێم دەڵێت:

من ئەوم، خۆیم..

ئەو بارانە غەمگینانەم بدەرەوە

کە بە ئیمزای ئەستێران نەبوایە، نەدەبارین..

من ئەوم،

شەرابی خوێنەکەم بۆن کە!

مەگەر نازانیت، بە تەنافی شەڕێکی ئیمپراتۆرەوە

دەرپێیەکی بەجێماو بووم،

ریشۆڵەیەکی مەلوول، لەترسی ئەوەی

داوە سەرخۆشەکان، لە عەورەتی نەڕوانن،

لەپێی کردم..
من ئەوم، خۆی.. کە هەمیشە پێم دەوتیت"
ئەو چنگە هەنگوینەی تۆ ڕشتت
من، یاخود سەرمایەیەکی لە عەزاب
لـێ کەوتەوە..
من ئەوم، خۆی.. کە هەمیشە لێم دەپرسیت:
کلیلی ئەم نەعشە بەکێیە؟
لە تەرمی — ئازادی- ی زیاتر،
کاممانی تیا ڕاکشاوین؟
ئیتر لەوێوە، لەو پرسیارەوە
پەرداخێ کە پڕ بوو لە بزەی مەعدەنیی،
پەنجەرەیەک کە پڕ بوو
لە سەمای ساکاری چۆلەکەکان"
هاڕەیان کرد..
ئیتر لەوێوە پێت دەوتم"
ئێمە ئەو خاچە شووشەییەیانە بووین
پێش ئەوەی ڕووناکییمان لەسەر بڕوێ

هێندەیان گیای درۆ و تەنیایی
بە جەستەماندا هەڵواسی،
تاکو لەگەڵ شەوە مۆرەکانی مردنا
لێمان بووە شەڕ و هەرا و،
ئێمە دۆڕاین...
ئیتر لەوێوە، پێت دەوتم"
ئێمەی منداڵە هەمەجییەکانی ئیمپراتۆر
کە لە خێڵەی شەڕەکانی ئەودا
شەختەی زەمەنمان
بۆ مەلەکردنی خەیاڵیترین سەفەر دەشکاند..
کە خەریکی نووسینەوەی ترس و خەونی باراناویی
باڵندە غەریقەکانی ئێوە بووین.
لەو چیرۆکە سەیرانە دەچووین،
کە لەگەڵ گڵێنە قاوەییەکاندا
خزانە نێو ئیکلیلەکانی شیعرەوە!
ئیتر لەوێوە، لەو پرسیارەوە، پێت دەوتم"
چ فانتازیایەکی رەنگینە، مردن.. ئەوکاتەی
بە رێگای سورمەچنی شەهادەتا
چاوێک لە دەریا قەرز دەکەیت و،

پەرژینێک لە خوا و،
داستانێک لە فەجری بۆ تۆ بیا..
هەر بۆ ئەوەی، سەیرانی پۆلــێ کوکوختی
بۆ (پارکی ئازادی)
یان بۆ (باخچەی گڵکەندا)، نەشێوێ..
هەر بۆ ئەوەی، هاوڕێکەم بەدیار تەماشاکردنی
سونبولەکانی ئاگرەوە،
گەڵا سەرخۆشەکانی کە لە مەرگ بەردەبنەوە،
نەژمێرێ و
سروشت لە جامێک بێهودەیی‌دا، نەبینێ..
لەوێوە پێت دەوتم" چیی دەبوو گەر، ڤایرەسێکی
سەیر بوومایە و
بە ئاوێک لە ئاوە روونەکانی تاعوون،
خۆم بشۆردایە، چیی دەبوو؟
پێت دەوتم" خوایە تۆش گەمارۆیەکی تر بوویت
لە بالاّی تەڕی ڕێگاکانمەوە ئالاّیت..
تۆ، لەناو دڵێکدا، سێبەری وەهمێکت لەخۆت ئەتەکاند

کەچی من هێشتاکە،

باسی ئەو گالیسکە بێدەنگانەم دەکرد

مردنیان بۆ باشووری بەهەشت دەگواستەوە!

هێشتاکە لەو کۆنە کڵێسایە ئەدوام،

دەستنووسی برینێك و

قوتوویەك زەنگیانەی عیشقم تیادا جێهێشت..

هەموو ڕێگاکان شارەزا بووم

کەچی لەگەڵ — لۆرکا — دا،

نەچووینەوە سەر دەروازەکانی — قورتوبە-!

لەناو قەڵایەك خۆڵەمێشدا،

بۆ ئەفسانەیەکی خۆمان دەگەڕاین و

ناونیشانەکەیمان ون کردبوو،

بەڵام یەکەم دێڕی وابوو:

کێ بەسەر ئاگرەوە بگیرێ،

دەبێ بە نەفرەت خۆی بشوات!

دەبێ چاوەکانی ببەخشێتە گڵۆپەکانی

هۆڵی نووستنی ئیمپراتۆر!

دواتر، حیکایەتخوان کە هەر خۆمان بووین"

دەمانووت:

بە خۆمان بوو.. هەر لە گیرفانی شەوەکانی خۆماندا بوو

کلیلی ئەو نەعشە سەفەرییانەی

گوڵە باشوورییەکانیان تێدا ڕاکشابوون!

هەموو شاخەکانی چاوەڕوانیی، بەسەر پشتی خۆمانەوە

لە قەفقاسی دنیایان دەڕوانی..

لە خواوەندی ئاگر دەپاڕاینەوە،

پیرێتیی ئەفسانەکانمان پێ ببەخشێ..

فێرمان بکات"

بە مۆسیقا و کتێب و ئەستێرە

بڵێین" سوپاس..

ئەوکاتەی بۆشایی نێوان قسەکانمان

پڕدەکەن لە ئاو..

دیسان، لەوێوە پێت دەوتم"

دەبێ تۆ داوای لێبوردن لە من بکەیت،

من بە سیانزە ساڵیی، بیست و یەک شەڕم بینی و

لە باڵق بوونیشا

لەجیاتی جەستەی حۆرییەک،

پۆرترێتی ئیمپراتۆریان نیشان دام..

لە باڵق بوونا.. ئیمپراتۆر هەموومانی رووت کردەوە و

لە گۆمی خەتاکانی خۆی هەڵکێشاین..

هەموومانی خستە ئاوێنەکانی ئیشتیهاوە،

ئیشتیهای تاریکیی،

بۆئەوەی سەما لە گیا و گوڵەوە، فێرنەبین!

لە ئێوارانی ئیمپراتۆردا، دەشێ بە یەکتر بگەینەوە

دەشی جارێکی تر، نهێنیی نێوان

باخچە و گوێزانت بۆ باس بکەم..

دەشێ قسە لەبارەی خەونە بە تاڵەکانی — ئاو — ێکەوە بکەم

هێشووە ماسییەکانی پێکەنینی، غەرق کردین،

خواش گوێی لێم بێ!

دەشێ بەبەرچاوی خاک و خۆڵەوە،

دەریایەک سەفەر بگوێزینەوە لای قرشە چاوشینەکان

*بە — زۆربا- ش بڵێین ئەوەتاین،*
*ئەوە ئێمەین: نازانین دایکمان خیانەتزەدەیە*
*یان، خۆمان؟!*
*ئەوەتاین، بەباوەشێ پشیلەی حەرامزادەوە*
*هیچ شەمەندەفەرێکی غوربەت، بارمان ناکات!*
*لە ئێوارانی ئیمپراتۆردا، نەبادا بەیەکتری بگەینەوە*
*نەبادا بگەڕێینەوە دۆزەخ!*
*ئیمپراتۆر، پێڵاوەکانی لـێی بێزارن،*
*هێندەی بۆ سەرداب و ژێرزەمینە تاریکەکان*
*ڕاپێچ کردووین!*
*دەستەکانی، داد و بێدادییانە لەوەی*
*هێندەی لە گەردنی سەدان گوڵدا،*
*بوونەتە پەت!*
*ئیمپراتۆر، لەنێو خودەی هەر جەنگاوەرێکدا*
*پەیکەرێکی بچکۆلانەی خۆی دادەنێ..*
*لە ئێوارانی ئەودا، ئەگەر یەکێ لە ژنەکانی*
*نەچێتە حەوزێ ڤۆدگاوە*
*ئەو شەوە دەبێ تەنیا بێ و*

بەدزییەوە، گەمە لەگەڵ بالیفەکەیدا بکات!

لە ئێوارانی ئەودا، نەبادا سەگەکانی ئیمپراتۆر لە دەرگا بدەن،

نەبادا بگەڕێینەوە دۆزەخ،

کاتێ بەیەکتر دەگەینەوە:

دەبێ لەجیاتی ماچ، شەرابی دڵگوشرانمان پێ‌بێ!

لەجیاتی رەیحانە، بۆنی زیندانمان لـێ‌بێ!

لەو ئێوارانەدا، نەبادا بگەڕێینەوە دۆزەخ،

گوڵدانێکم لەپشت گەمارۆی

رەنگەکانەوە بۆ دانێ!

من هەر ئەوەندەم لەدەست هات،

چنگێ پشکۆ رۆکەمە شەمعەدانی

نێو ئەو هێلانە خاپوورانەی

هەتاکو لێواری سەهۆڵ،

لەرز و تای شەڕ، کوشتبوونی..

من هەر ئەوەندەم لەدەست هات،

نیوەڕۆیەکی سەفەر، لەگەڵ موعجیزەی

بارانێک ماچدا

لەتەنیشت ئوتوبوسێکی ڕێگای دۆزەخدا،
ئەوکاتەی کچێک کە بە سەراب دەچوو
لەتە ئاوێنەیەکی دەرهێنا و
ماکیاژەکەی تۆخ کردەوە،
هەر ئەوەندەم لەدەست هات،
چنگێ تلیاک بخەمە مشتی پاسەوانەکانی ڕێگاوە،
ڕێگای نێوان ماڵەکانی شەمشەمەکوێرە و
کوختە دارماوەکانی ئومێد!
هەر ئەوەندەم لەدەست هات،
خۆم بەو پاسدارە ریشن و، جەندرمە بێ سمێڵانە بناسێنم،
منیان کوشت و
دەم و لووتی براویشمیان،
دەرخواردی سەگە بێدار و برسییەکانی
ئەو ناوەدا!
من هەر ئەوەندەم لە دەست هات،
بە سنوورەکانی تۆفان بڵێم،

ڕێم بدەن پۆلــێ ئاواز بەرمەوە لای

ئەو باڵندە سەقەتانەی

کە لە ئینجانە تۆراون!

ڕێم بدەن، بچمە سەردانی ئەو پرسیارانەی

کە بە درێژایی ڕێگا چۆڵەکانی نەگەیشتن

خۆیان لەنێو بەفری سەفەردا،

نقوم دەکرد!

* * *

دیسانەوە، ئێوارانی ئیمپراتۆر..!

لەو ئێوارانەدا، لەم ئاوێنە بـچوکەدا / جێگــەی چـاوم نابێتــەوە / گریـان هەندەسەی ڕۆژگارێکە / بەیانیانی یەکەمی هەموو جەژنێ / دەمباتــەوە سەر گــۆڕی کوڕەکــەم / کــوڕە شــەهید و نامۆکــەم / لــەنێوانی یـانزە قەبری بازنەییدا / نازانم کامەیان بـۆن کـەم / بـاوەش بەیەکێکیانــدا دەکــەم / ئەمەیانــە .. نــەء .. ئــەوەیان / نایدۆزمــەوە.. / ناچـار .. / یەکێکیان دەکەمە گــۆڕی ئــەو و / بــەخۆم دەڵــێم: / ئەمەیانــە .. ئـا .. ئەمەیان / تێر باوەشی پێدا دەکەم.. / دەڵێم ئۆخــەی.. / ئیـدی تــەمی بەیانیانی سەر پەنجەرەی تەنیایی ناسڕم.. / ئیـدی سوپاســی گــەرم و

گورِپی مێژوو ناکەم.. / لە دەرگای هـیچ وەرزێکـی دیکـەی گریانـەوە /
ناچمە ژووری فرِینەوە.. / قفڵی هیچ گومانێ
ناترازێنم..
من لەو قسە و باسە شیرینانەدا بووم،
خوا گوێی لێم بوو!
دیسانەوە، بردمیەوە لای ئێوارە تاڵەکانی ئیمپراتۆر!
ئەو، بەشێکی ئێواران،
لە لستنەوەی پاشماوەی ئەو شەرابە یاقوتییە بەسەردەبات

کە لە ترێی مەمکی شازادەیەکەوە، دەتکێ..
لەوێوە، جەستەیەک دەست پێدەکا و
جەستەیەکی دی، کۆتایی دێ!
لەوێوە، من هەزارەمینی ئەو ئاوێنە شکاوانەم
ئیمپراتۆر، پارچەکانی بەسەر برینی
قوربانییەکانی خۆیدا وەردەکات..
لەوێوە، من هەزارەمینی ئەو ئەسپە ماندووانەم
کە خواوەندیش، تفاق و بارە قورسەکانی

شەڕی پێ گواستمەوە!

ئیدی لەوێوە پێت دەوتم،

ئێمەی مناڵە هەمەجییەکانی ئیمپراتۆر،

کاتێ پێکەنینمان لــێ دەپژا،

روخسارمان قەوزەی شینی دەگرت..

کە دەچووین باخەکان ببڕین، هەنار بدزین

گۆرەویی کۆڵۆنمان لەسەر و دەم و چاو دەکرد..

کە دەشگەڕاینەوە، نەماندەتوانی بڵێین،

گۆمێکمان لە رێ بینیوە،

تیایدا بۆقێک

مانگی لەپێی خۆی کردبوو..

ئێمە هەموو، مناڵە زۆڵ و سەقەتەکانی ئیمپراتۆر بووین،

لە بەرمیل و زبڵخانەکانی

قەرنێکی تری شەڕەکانی ئەودا،

نە، عاشق بووین..

نە، مەعشوقەیەکمان هەبوو،

ئێمە هەموو، سەر و خواری رێگاکان

بەڵەد و شارەزا بووین،

کەچی هەرگیز، ئێمە هەرگیز،

*لەگەڵ (لۆرکا) دا*

*بە (قورتوبە) نەگەیشتین و*

*نەگەیشتین و..*

*کە گەیشتین..!*

*گەیشتن وردوخاش ببوو!*

1997 سلێمانی

* ئـەم قەسـیدەیە لـە دووەمـین فێـستیڤاڵی گەلاوێـژدا لـە سـلێمانی خوێنراوەتەوە.

# بە سەفیرەکانی عیشق بڵێ .. .. ..

*** - با – بێزار نابێ**

**لە بەخشینی هەردوو مەمکی،**

**بە لێوەکانی ئاسۆ..**

(ئەدۆنیس)

*** ئەی تۆ"**

**لە بەخشینی کام شتی خۆت بە من،**

**بێزار نابیت..**

(هابیل یوسف)

*بەڵام (بەریدی عاشقان) هات و،*

*عیشقنامەی گوڵ و بەرد و ئاوی پێ نەبوو..*

*هەندێ پێناسەم هەبوون بۆ تۆ،*

*بۆ نەورەس و جەنگ و باران،*

*دەمویست لەسەر پێڵووی شەو،*

*مێخەکییانە بیان نووسم..*

*- بۆنژۆ، هاوڕێ! نەمدیوە عەتر و قاوە پێکەوە*

*لەبەردەم پیاوە تیمساحییەکانی*

*کەناردا، نۆش کرێن!*

*بۆنژۆ، ئەی ئەو کچە غەریقەی*

*ئەی ئەو ماسییە عەزرایەی*

*لەترسی رۆح دزێکی تر"*

هەتاکو روانین دەڵێ بەس..

تابووتەکانی خۆشەویستیت بۆ دەژمێرم!

- بۆنژۆ، هاوڕێ!

گەر کەمێک تاقەتت ماوە

هەتا پاکنووسی ئەم شیعرە تەواو دەبێ،

لام دانیشە..

عاشقێکی سەمەرقەندیی، ئێوارەکانی دزیوم،

بە منالیی، ولاتی سەمەرقەند لای من"

کۆتاییەکانی بەهەشت بوو

چونکە لەوێوە ئاوێنە و عیشق و هەتاو

سلاویان لە ئێمە دەکرد..

هاوڕێ! بەدەم ژەنینی میلۆدیکای تەنیایی خۆتەوە و

هەتا پاکنووسی ئەم شیعرە تەواو دەبێ و،

هەتا بێداریی دەخەوێ،

هەندێ لەم چۆڵەوانییەی رۆحم، رابمێنە!

دواتر، لە مەنفایەکی وێرانەوە، بۆ مەنفایەکی وێران تر..

دواتر، لە قەرەجێکی پۆشتەوە، بۆ گەڕیدەیەکی رووت..

دواتر، چاوەکانم لە شەوی گفتوگۆی

جوتێ مەمکدا پێکەوە،

بەجێدێڵم...

کە دێمەوە، بەردەکان لەم شەرِستانەدا پیردەبن...

ئاوێنەکانی گیان، بۆ یادگار

سەفەری بووکەشووشە دڵشکاوەکان

دەنووسنەوە....

کە دێمەوە، چەرخی سەراحەت و

ژەنینی کۆنشیرتۆی عیشق، بەسەر دەچن...

لە تابووتێکی ژێرئاوکەوتووی پڕ ئەفسانەدا، دێمەوە...

تشرینی سێیەمی ساڵی دوو هەزار و نازانم چەندەمی

عیشق دەبینم

بە سووتیانی شینی کۆترە غەمگینەکانەوە،

لەجیاتی ماچ، گوڵی یەئس بۆن دەکەم،

بەسەر غەریبیدا دەکەوم،

کە دێمەوە،

نازانم حیکایەتی چەند رووخان و

خەمی چەندەم دڵبڕین و

وەهمی چەندەم خۆشەویستیت بۆ باس بکەم؟
کە دێمەوە، ئیدی نازانم...
بۆچی ئەو هەموو بەسەرهات و شۆڕشە جوانەمەرگانەی
کە عیشقی من وەک جەنگێکی ئەزەلیی گوڵ
دژی هەڵوەرین بەرپای کردن،
لە ئێوارەیەکی زیرەییدا"
سەدەیەکی فریشتەیی پرِدەکەن لە کوشتنی بەفر!
ئیدی نازانم بۆچی دێمەوە؟
- بۆنژۆ، هاورِێ!
- بۆنژۆ ئەی سەرابی هەشتەم!
سەردەرناکەم لە لوغزی قسە و باسە
شیعرییەکانی باران....
سەردەرناکەم، بۆچی کافتریا وێرانکراوەکانی
سەر بەندەرەکانی شەرِ و خۆشەویستی،
پرِ دەبن لە نەزیفی شەرابی ئەو ساقییە
بەهەشتیانەی
کوپە خۆڵەمێشییەکانیان"

فرمێسکی پێغەمبەرانەی تۆی نەورەسیان

لـێدەتکێ...

تۆ، باڵێکت کەوتە دەریاوە و،

باڵەکەی ترت لە ئاگرێکی سپی هەڵکێشا

کەچی رووتبوونەوەت لە چۆلەکەیەک خواست و،

سەدەفی گوناهێکی سەفەرییت لە من،

لە فڕینە سەوزەکانی من، قەرزکرد!

نازانم، بۆچی دێمەوە؟!

دەڕوانم، ئیدی ئێمە، مناڵ .... مناڵ بووینەتەوە

پێش ئەوەی مەغریبی پێکەنین دابێ

دەبێ خۆبکەینەوە بە ماڵی گریاندا،

رۆژە تەنیاکان، لەگەڵ مات بوونی تریفەدا

دەبێ بەدیار گۆمێکی پڕ ئەستێرەوە

دابنیشین"

ئەو ماسیە بێزمانانە بژمێرین،

کە ناتوانن پێکەنین بۆ مناڵیمان بگێڕنەوە

لە پێشوازی زایەڵەی دەنگێکی خەمناکدا،

دەبێ سرووودێک بۆ جەنگ...

***بۆ تەنیایی...***

***بۆ تەلأقی نیشتمان لە شۆڕش، بچڕین...***

***دەبێ وەک گۆزەکانی سەرشانی فیراق،***

***جۆرێک لە خەمساردییمان لـێبتکێ...***

***رۆژە تەنیاکان، ئەی سەرابی هەشتەم!***

***دەبێ مرواریی ئەو عیشقە لەچاو بگرین***

***کە شەرحی نوێژەکانی گوڵی لەبەردەم باخچەدا،***

***پێنەکرا....***

***کە نەیتوانی ئامۆژگاریی ئەو ماسیگرە تێشکاوە بکات***

***هەوری عاتیفەی راوکردین!***

***لەوپەڕی مەست بوندا، ئەو ماسیگرە تێشکاوە***

***باڵی کەنارییەکی ساحیری***

***لەبەرکرد و،***

***کچێنیی نەوڕەسێکی، لە پەرداخێک مەحاڵدا***

***مۆمیا کرد...!***

***ئاخر چیی لە وەفا دەبارێ،***

***کە دیوارەکان مێخەکی عوزلەتیان لـێ بڕوێ...***

ئاخر چیی لە وەفا هەڵدەوەرێ،

کە پەنجەرە و دیواری ژوورەکانی یەکتر ڕاموسان

بێ وەفابن...

کە زەمەن و سەعاتە ژەنگاوییەکانی

نێو پەنا و حەشارگەکانی

یەکتر هەڵمژین، بێوەفا بن....

ئاخر چیی لە فرمێسکی (وەفا) کەم،

کە مەست بوون خۆشی بێوەفابێ...!

- بۆنژۆ، هاوڕێ!

ئەمێستاش (بەریدی عاشقان) نەگەیشت و

ئەمێستا بەتەنها خۆت و، هەر خوای خۆت و

بەتەنها مێژوویەک پاکیزەیی و،

بەتەنها پەیژەی ئەو یادانەی

دەنگی پایزی پیادا سەردەخەیت

بەرەو وەرزی ئاشووفتەیی

هابیلێک و خوێنەکەی خۆی!

ئەمێستا لەبەردەم پەیکەرەکانی ئاشنابووندا،

بادەی شیعرێ نییە، پڕنەبێت لە گێلاسی

ماچ و سیحری پێک گەیشتن...
ئەمێستا گەڕانەوەیەک نییە،
قەتڵ و عامی وڵاتی جەستەی تۆ و،
ژنە غەریبەکان کە شەوانە
تەنیایی بەخۆدا ئەدەن،
باس نەکات!
چیرۆکی رەنگێک نییە، پەمەیی تر
لە گەڵای ئەو سێوانەی
ترسام وەک پەشمەک لە دەمما بتوێنەوە...
- بۆنژۆ، هاورێ!
سێ شەممەیەک لە ماڵی وەفادا،
پەنجەرەیێک بۆ روانین بخوازە
سێ شەممەیەک" چاوەرێ بە، پێت دەڵێم:
من پیاوی ئەم چەرخە نیم،
من شەرقیەتی خۆمم
لەبەردەم رۆح دزێکدا، لەدەست داوە....
ئەو دەمەی، خۆر نشینانێ، داوام لە خواوەند کرد،

***هاوڕێیەتیم قەبوڵ بکات،***

***ئەو، چاوی خۆی نیشان دام،***

***سێ شەممەیەک، چاوەڕێبە، پێت دەڵێم"***

***بێزار بووم لە نووسین.... بێزار....***

***ئیدی با نووسین تەواو بێ، پەنجەرەکان بکەینەوە!***

***با سەیری وڵاتێک بکەین، شمشێری تێدا ئەڕوێ***

***دەرگای باخچەکانی شکاون...***

***تێرمیناڵ و. پاصەکانیشی، کورسییەکیان تیا نەماوە***

***خۆشەویستی پشوویەک بدات و***

***لە شەقامێکەوە بچێ بۆ شەقامێکی تر...***

***ئیدی با نووسین تەواو بێ"***

***با لەسەر گۆڕەکانی ئاییندەمان،***

***ماچە دیلەکانی یەکدی ئاڵوگۆڕ کەین....***

***من ڕۆحێکی بێزارم لە وەهم و گومان و قەدەر!***

***من شەوێکم، لەحیاتی ئەستێرە،***

***پێم خۆشە عیشق بگرم...***

***تۆ دەڵێی: لەزەتی نەماوە،***

***ئیدی بۆ یاری لەناو ئەم فرمێسکانەدا***

دەکەیت؟
وەرە دوای بەسەرچوونی پیرێتیی
ئەو باڵندانەی
غەریزەیەکیان نەماوە بۆ فڕین"
قسە و باسێکیان لەگەڵ زەویدا نیە،
وەرە با چەند مەترێ لە فەزای خەونەکان
بەکرێ بگرین،
ئەوێ مەزاری ئەبەدی ئێمەیە، ئەوێ...
دوور لە چەمۆڵەی رۆژگارە هیچ و پووچەکانی
عادەت.....
دوور لە شمشاڵی درۆزنانەی راڕایی...
لەوێ، لە دەرەوەی زۆرانبازیی
لەگەڵ رەشەبای مەراقدا،
لە دەرەوەی گەمەی خیانەتبازیی ئاو
لەگەڵ ماسیەکانی ئابڕوودا...
لە دەرەوەی رۆژی حەوتەمی (خەلیقەت)"
لەوێ لە ئینجانەیەکدا دەخەوین،
وەک کبریائی ئاسمان، رەنگی ئاو دەگرین...

لەوێ، لە دەرەوەی کوشتنە ناوەختەکاندا

لەسەر ئەو رۆژنامانە رادەکشێین،

کە هەتاو: سەرنووسەریانە....

کە دەریا: بەدزیی راوچییەکانەوە،

شەرە قسەی نێوان کاپتن و

نەهەنگەکانی تێدا دەنووسێ...

- بۆنژۆ، هاورێ... لە مەغزای ئەم بۆنژۆیەی

خۆم تێناگەم"

پەمەییتر، وەرە پێشێ..

سەرابی تر، ماچم بکە..

کەی لە فەجرەکانی بریندا،

سڵاوی تاریکی، لەگەڵ جگەرەدا کێشراوە؟

هەتا کەی بە کوژراویی بگەرێینەوە لای بێدەنگی..

هەتاکەی گژوگیای ئەم حەنینە، بە جەستەمانەوە

بڕوێ..

لە مندا نغرۆبە.. منێک لەسەر شووشەی

پەنجەرەکانی زەمەن،

کەڵەکە بووم...

ناچار پارچەیەک لە دڵم ئەبڕم

بەبێ دەنگی، کەڵەکەبوونی خۆمی پێ دەسڕمەوە و

*لەودیویشەوە مناڵێک وەک یەزدان دەستم دەگرێت و*
*تاجی شێت بوون دەکاتە سەرم..*
*ئەوە خۆمم، هەر بەتەنێ خۆم و بەس!*
*بە نیشتمان دەڵێم: دەخیلتم چیدی پەریزادەکانم*
*جێمەهێڵە...*
*دەخیلتم چیدی باوەڕ بەو هەورە حەسوودانە*
*مەکە"*
*زەفەر بە خۆم و*
*بە دڵم و*
*بە فرمێیسکەکانم دەبەن...*
- *بۆنژۆ، هاوڕێ!*
- *بۆنژۆ ئەی سەرابی هەشتەم*
*ئەمجارەشیان درەنگ هاتیت"*
*ئیدی جاڕی بێزاری لە نووسین ئەدەم..*
*قسەکانی بەهەشتم*
*لە تەپڵەکێکی شکاوی جگەرەدا، دەکوژێنمەوە...*
*جوانترین ساڵەکانم کەلاوە بوون،*
*رازاوەترین میحرابی ئەوینم،*
*پڕکران لە فانۆسی تەنیایی..*

***ئەی ساڵی عەزاب..***
***ئەی دوا مەنزڵی چێژبینین***
***لە هاتنی وەرزی درۆ و دڵسافی،***
***من بێزار بووم لە نووسین... بێزار...***
***تۆش درەنگ هاتی و،***
***نیشتمانیش رۆیشتەوە بۆ ناو جەنگەڵستانەکەی خۆی***
***تا دەستنوێژ بە شەرەکانی بشوات..***
***دەمێک نییە جێتان هێشتووم،***
***دەمێک نییە بەم لوتکەی تاریکیەوە مردووم،***
***ئیدی دەست ناخەمە شاعیرێتی گەردوونەوە،***
***ئیدی نهێنیە سادەکانی جۆگەلە***
***لای رووبار باس ناکەم...***
***ئیدی سەری خۆم و لە کۆچ و برین و عەزاب و***
***بێمروەتیی ئاگردا***
***سپی ناکەم...!***
***هاوڕێ...***
***بۆنژۆ...!***

* بۆنژۆ: (بە زمانی فەرەنسی) واتا بەیانیت باش!

# بەردەوان . . .

**چەند سەرنجێکی گوڵنارییە لە نەمردنی هاوڕێم**

**(عوسمان چێوار)**

** غەریبیت باش، بەردەوان..!*

*بەم بەیانییە سادەیە*

*ئەو بەردانەی بەکۆڵتەوەن*

*کامیان لە هیی (سیزیف) دەچێ‌‌*

*بەردی شۆڕش،*

*بەردی شانۆ*

*یان بەردی کورد؟!*

*بەم بەیانییە سادەیە*

*لە پەنا ئەو دەریا غەمگینەدا چیی دەکەیت،*

بەنیازیت خەمێکی وەک خۆت سەرسپیی
بۆ کچە گۆشەگیرەکانی کەناری پایز شەرح کەیت
یان وەک جاران چاوەڕێی هاتنەوەی
ئەو قەیاغە مارۆنییانە بکەیت
کە رۆژانێ تریفەیان بارکردبوو،
سەوڵیان بە عیشق لێئەدا..
* غەریبیت باش" بەردەوان
ببورە لە خەوم کردیت
مەگەر تۆ، هەمان قەڵەندەرەکەی
جاران نیت
دەتویست لە پەنا سادەییدا
ژوورەکە پڕکەیت لە دوکەڵی جگەرە و
بۆنی چا...
هەر بە سادەیی، بەختی شیعر
بۆ پەریزادە بەدبەختەکان،
بۆ سەرابە ماندووەکەی من،

بگریتەوە...

بە سادەیی، ورتە ورتێکت دەکرد و، دەتوت:

با عاریفانە هەوڵ دەین"

ببینەوە بە کوڕی ئەو خێڵە قەرەجییانەی

شمشاڵیان دەکردە تیرۆک و

گەڵایان پێ دەشێلا بۆ نان...

ئەو خێڵە قەرەجییانەی

ددانە کلۆرەکانی ماتگیان دەکێشا و

ئەستێرەیان لەجێ دەچاند..

* غەریبیت باش" بەردەوان!

تۆ ئێمەت فێری ئەوە کرد

وەرزەکانی دڵنەوایی

ببەینەوە بۆ کوختەکانی (گولعومەرا)،

ئەو کوختانەی لە کەتان چنیبوومان!

فێرت کردین

رێز لە ماتگرتنی ئاو بگرین

ئەوکاتەی وشکانیی، بە زۆر

فاتوورەی دەعوەتە ساختەکانی

بارانی پێ دەسپێرێ!

غەریبیت باش،

ئەی موغانی ئەو عومرەی

یەکێ لە بەردەکانی سەرشانت

کە بەردی سەفەر بوو، سەفەر،

بە کۆڵی چ شیعرێکەوە نەدەنووسا...

تازە روخسەتی چیی لە مردن دەخوازیت

کە زیندەگیی دو دڵ بێ

لەمانەوە لەنێوان کەلاوەکانی عومرێکی فانیی و

گوێنەگرتن لە نائومێدیی

(مەڵ)ە شەکەتەکەی (چیخۆف)!

غەریبیت باش" بەردەوان!

کە هاتمە لات

باسی مێژووی ئەو دیوارانەت لا کردم

کە لە باخەڵی قوڕدا نووستون و

برینی ئەو باخچە نەزۆکانەت نیشان دام

کە بەناوی گوڵ و نەمامە بێئاگاکانەوە،

سەدان ئاشووب، دژی هەتاو دەگێڕن!

بێهوودە بوو کە هاتمە لات

گۆڕێکی هێمن و لەسەرخۆ نەمابوو

هەندێ ڕاکشانی تیا قەرزکەم...

سنووقی گومانێک نەمابوو،

سێبەرە هەڵاتووەکانی حەقیقەت و

دۆستایەتیی کوژراوی

نێوان کلیل و دەرگای

خوار و ژووری نیشتمانی تێدا

بشارمەوە!

* غەریبیت باش

ببوورە لەخەوم کردیت

ببوورە عەزابە نووستووەکانت

ئەدەمەوە دەست بێداریی...

ببوورە تا ئێستا ماوم...

# کەسێ نەبوو تووڕە ببێ!

ببیستن، لەم ئێوارەی مروەتەدا
کێ لەگەڵ مندا ئەم دەنگە دەباتەوە
بۆ سەرزەوی..
ببینن، لەم کەڤاڵی برینەدا
کێ لەگەڵ مندا ئەم رەنگە
دێنێتەوە قسە خۆشەکانی جاران..
دەنگ/ بۆئەوەی ئاوەکان
لە غەرق بوونی خۆیان وەئاگا بێن..
رەنگ/ بۆئەوەی ئەو رووخسارانە ببینین
پاش نقووم بوونی دەمامکە رەشەکانیان
زیتەزیتی چاویان

بەو چرایانە دەچن، یەک ئەوی تریان دەشکێنێ!

* من لەگەڵ ئەوانم بوو، ئەوانم ئەدواند..

کەچی تۆ ئەی کچی گیا، ئەی نەسلی باران!

لە ئێوارەی باخچەیەکدا، پێت وتم:

کە شمشێریان بە رووی بەفردا هەڵکێشا

ئیدی کەس نەیتوانی،

قسەکان بەرێتەوە ماڵێ

کەس نەیوێرا بە مەسافەکانی نێوان

مەرگ و عیشق بڵێ:

- چەندە کورت و کەم خایان بوو،

چیرۆکی ئەو عومرەی

لەسەر هەڵمی درۆکان، نووسرایەوە..

هێشتا بناری ئەو قسانە، خڵتانی

وەنەوشەکانی برین بوون

ئەی کچی گیا!

تۆ ئاوت کرد بە گالیسکە و

تۆ لە پاڵتۆی کاهینێکدا،

***ڕووتبوونەوەی خۆتت جێهێشت!***

***نازانم من لەم چیرۆکە هاتمە دەرێ،***

***یان تۆ گوڵێک بووی  لە گوڵە شەرعییەکانی***

***پێک گەیشتنی جەستەی نێوان***

***باخێ یەئس و***

***کانییەک دوودڵیی و گریان!***

***ئەی کچی گیا!***

***لە قەفەسی ئەم چیرۆکە ڕووناکەوە،***

***یەقینێکی ئەرخەوانیی دێت و***

***ناهێڵێ چیی دی بە باوەش***

***تەم بگوێزمەوە ناو ڕەحمی ئەو باڵندە***

***چاو ڕەشانەی***

***لە گۆرانییەوتندا، لە ئادەمیی دەچن،***

***بە گوڵ و ماچ خۆیان دەشۆن..***

***ئەم چیرۆکە، لە ئێوارەیەکدا دەگێڕمەوە***

***نامەوێ چ ئەستێرەیەکی ڕووت***

لە شەربەتی حەرفەکانی بخواتەوە..
گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە،
وەک ئەوە وایە گوڵ ئاتەشێکی تێبەربێ
وەک ئەوە وایە، دەلیلی ئەم سەفەرە (با)یەک
بێ و
ئاوڵەی وەریوی وەرزەکانی جەنگ
کوێریان کردبێ..
یان رووبارێکی سیلاویی بێ،
گلەیی بەلەمەوانەکانی هاوڕێی، پیریان کردبێ،
دواتر، گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە
لە درزی ئەو دەرگایەوەی
چاوەڕوانی هاتنەوەی غوربەتزەدەکانی
دنیابێ،
وەک ئەوە وایە، بە ئاسمان بڵێی:
کۆشی خۆت داپۆشە
پۆلـێ چۆلەکە بەرێوەن
ژێرباڵیان پڕە لە فەساد!

لە دەرەوەی عیشقیشدا، ئەی کچی گیا، ئەی
نەسلی باران،
گوێگرتن لەم چیرۆکە
لە تەماشاکردنی مەمکی رووتی
میوە شازادەکان دەچێ
بەچاوی ئەو کاپتنە پیرانەی،
هەر بۆ زەوق، شەپقەکانیان پڕدەکەن
لە پوولەکەی ماسی!
لە تەماشاکردنی جەستەی خواوەند دەچێ
بەچاوی ئەو هەورە شەبەقییانەی
سەرلەباران دەشوێنێنن، کەی بباریێ!
ئەم چیرۆکە، لە پەرداخێکەوە رژا
کریستاڵەکەی پەرژینی دڵی من بوو..
بەیتەوانە مێینەکانی دەرەوەی مێژوو
مرواریی ئەم بەیتەی ئێمە وا دەهۆننەوە و
دەڵێن:

* ئێمه سێ هاورێی سەیر بووین،
یەکەممان، کائینێ بوو سەربە خێڵی ئاگر..
دووەممان، خەڵکی شارێ بوو
پیشەیان داتاشینی خاچ و
تابووتگەریی بوو..
لەو شارە، کەس نەبوو دەستی رووناکیی
بگرێت و
سکێچە خوار و خێچەکانی ئەڤین
لەسەر تەختەرەشی پۆلەکان بکێشێ..
لەو شارە، ئەگەر خۆت لەگەڵ جەمعی
ئەو ئەستێرە بێدارانە ناو نووس بکردایە
کە هاواریان دەکرد:
ئەی عیشق، هەوڵ بدە، ژەنگ لێت نەدا
لەولاوە پیرەدرەختێکی کرمۆڵی جبە لەشان
دەهات و
وەک موراقیبەکەی جارانی پۆل
ناوی لە لیستی گوڵە زۆر هارەکاندا

دەنووسیت،
تاکە باخەوان هاتەوە
بە ڕەشەبا وەدەرت نێ!
ئێمە سێ هاوڕێی سەیر بووین،
سێیەمیشمان: لەسەر ئەڵقەی
شەپۆلە تەڵخەکان
بە مرواریی بێدەنگیی
قووبەی بۆ گۆرانییەکانی
سەبری خۆی هەڵدەچنی
ئێمە هەریەکەمان گۆڕی سەفەریی خۆی بە
کۆڵەوە،
کە بڕیارمان دا، لەترسی پەتای کوشندەی
شارە جەنگەڵییەکان هەڵێین،
بیست و یەک شەوی تەواو بوو
هەریەکەمان حەنینی خۆی
بە قفڵی دەرگاکانی ئەو زیندانەوە جێهێشتبوو

که هێندە تاریکیی و،

شۆی ئازار و،

عەزابی شەڕ لـێی دابوون،

قفڵەکان خۆشیان

نەیاندەزانی دەچنەوە سەر کام

مەعدەن!

هەریەکەمان، بیست و یەك شەوی تەواو بوو

کە ئەگەر بەگریان پێوانە بکرایە

یەکی حەوت گلێنەمان بەردەکەوت..

لە بیست و یەکەمین شەودا،

لە پشوویەکی کورتی ناو سەنگەرێکی

رووخاودا

- یەکەممان، گۆڕە سەفەرییەکەی بیرچوو..

- دووەممان،

لەبەئەوەی باوکی تابووتگەرێکی ناسراو بوو،

گۆڕەکەی لەسەرشانی روا بوو..

- سێیەممان

چونکە لە قوببەکانی ئاو شارەزا بوو،

چونکە عاشق بوو،

بە خەمساردییەوە پێی وتین:

خەمتان نەبێ،

هەموو زەمین، گۆڕێکی جوانە بۆ ئێمە!

ئیتر لەو شەوەوە،

خێڵی ئاگر و

خێڵی تابووتگەران و

خێڵی عاشقان، بڕیاریان دا:

سێ هاوڕێی سەیر و، خاوەنی یەک کراس بن!

سێ نەدیمی یەکتر و، خاوەنی تاقە یەک گۆڕ بن!

- ئێمە، سێ هاوڕێی سەیر بووین،

ئەوکاتەی هەستمان دەکرد

لە ناوقەد بەرەو ژووری هەریەکەماندا،

گوڵە رازیانەی کۆستێک دەڕوێ،

ئەو گوڵەمان دەخستە سەر هەر بەردێ

بەرد، خۆی لە بۆنەکەی دەتەکاند..
دواجار، بەناوی خۆشەویستی و
بەناوی ئەو وەسوەسە غەددارەی
مەسیحی هێنایەوە سەر زەمین،
بە زەمینمان وت:
- ئەی زەمین،
کۆتایی تۆ لەکوێوەیە کە ئێمە دەست پێدەکەین!
ئەوەمان وت و،
دواجار شوێن قسەی غەریبێ کەوتین
پێش وەخت سەعاتەکانی دەستمانی
پێ خستبووینە سەر
چارەکی بوێ بۆ گومڕابوون،
بۆ وێنەی گوڵەکان!
ئەو غەریبە، هەر یەکەمانی راسپارد
لەکۆتایی نووسینەوەی هەر مردنێکا
نە نووسین، ماوێتی..
لەناو پاشماوەکانی لاپەڕە حەوتیشدا

*تیرۆرکردنی هیچ ئنیشتمان[ ێک*

*ئیعلان نەکەین..*

*ئێمە سێ هاوڕێی سەیر بوون، سەیر!*

*شوێن قسەی غەریبێ کەوتین،*

*خۆی نەبوو، مەرگ بوو..*

*لە ئاو پاڕاینەوە،*

*ئەگەر پێویست نەبێ، نەمانکوژێ..*

*بە سەدەفی کەنارەکانمان وت،*

*ئێمە خەرقەمان پۆشیوە،*

*لە گیرفانی شیعرماندا*

*لە باخەڵی قسەماندا*

*لیرەی حەرفێ نادۆزیتەوە*

*رەسمی گۆرانییەکی ئەتک کراوی*

*لەسەر کێشرابێ!*

*ئێمە سێ هاوڕێی سەیر بووین، سەیر!*

*لەناو قەیرەیی ئەو هەموو رەز و ترێیەدا،*

شەرابمان لە رۆحی گوڵە یاسەمینەکان

چێ دەکرد..

لە خواردنەوەی یەکەمین پێکدا،

من گوێم لە چزە چزی

دامرکانەوەی پشکۆی ناخی یەکێکمان دەبوو،

نەمدەزانی کاممانین..

ئەوەمان کە سەر بە خێڵی ئاگر بوو،

پێی دەوتین:

گوێ بگرن.. ئەو دەنگە

ناڵە ناڵی سەرە مەرگی زەمینە

بەو هەموو قەداسەتەی خۆیەوە

لە بەینی ئێمەدا دەمرێ..

بەو دەم و لەبزە شیرینەی خۆی،

ئەو هاورێیەمان قسەی بۆ دەکردین و

چاوی بڕیبووە زەمەن

چۆن ئێمە لەبیردەکات و

چۆن لە نوری ئاتەشگەدەکانی خۆیمان

بێبەش دەکات..
هەندێ جاریش بە ورتە ورتێکەوە دەیوت:
لە ڕێگا، تووشی نزای تارژەنێ دەبین
کە چاوی چەپی شووشەیە و
هەمیشە لەگەڵ ڕەنگەکاندا، مشت و مڕێتی..
بەدەم هێنانە قسەی ژێی تارەکەیەوە
بەدەم ئێوارە باشی تێکەڵ بە نووزەی
تەنیایی پەنگوینەکانەوە،
نەواری دەریایەک
یان جانتای خاڵیی تارەکەی
پڕدەکات لە مینای ئەو سۆزەی
کە لە قوددای ناشتنی
عیشقێک هەڵدەستێ!
ئێمە سێ هاوڕێی سەیر بووین،
لەسەر خوانی زمان،
یەکترمان داوەتی فێربوونی

حیکمەتەکان دەکرد..

دووەممان هەمیشە دەیوت:

دەبێ من باجی فرۆشتنی ئەو تابووتانە بدەم

کە باوکم دوای پڕکردنەوەیان

بە تەرمی جەنگاوەرەکان،

هەر خۆیشی، فڕێی ئەدانە دەریاوە..

ئەو پێی وابوو، کاتێ وتارە حەماسدار و

مێژوویی‌یەکانی نەهەنگ

لە ئاپۆرای ماسییە زەلیلەکاندا

وەکو بنێشتیان لــێ دێ،

ئەو کات بڕوانن زەمەن چەندە

ئەشکەنجەگەر دەبێ..

زەمەن چەندە ماسۆشییانە

کەیفی بەو زوڵمە دێت

کە مێژووی شمشێر لە ئێمەی دەکات!

هاوڕێی سێیەممان پێی وابوو:

لە ڕێگا، ئەردەڵانییەک دێت و

بەو ژنێتییەی خۆیەوە
پێمان دەڵێ:
تازە ئێوە/ بۆ گۆڕێك بگەڕێن
نەفرەتەكانی خۆتانی تێدا بشارنەوە..
سەفەری ئێوە/ سەفەری گەڕان بوو
بە دووی ڕەنگێكدا
نە بۆ گۆرانیی،
نە بۆ شیعر،
نە بۆ گەڕانەوە بۆ لای
جەستە مۆنالیزاییەكان نەشیا!
ڕەنگێ، نەیتوانی لە مەنبەعی
پێكەنینی گوڵەوە بدوێ..
ڕەنگێ، نەیتوانی بە دووربینی ئەهلی دڵ،
تەماشای مەوجی ئەو برینانە بكات
كە یۆتۆبیای برا خەسیوەكان
گوڵدانەكانی حەسرەتی ئێمەیان

پێ ئاو دا!

ئەو هاوڕێیەمان پێی وابوو،

ئەو ئەردەڵانییە پرچ خورماییە،

دێت و، بەو ژنێتییەی خۆیەوە

هێندە بە هەیبەتەوە ئەدوێ،

دیوارەکان، لەجیاتی گوێی جاسووسیی

هەڵخەن

چاوی ئەوین، دەبڕنە قسەکانی ئەو..

ئەو ئەردەڵانییە، هێندە گەزۆی عەقڵ

لە قسەکانی دەبارێ،

لووتەکان پەشیمان دەبنەوە لەوەی

ڕۆژێک بووە چوون بۆنیان

بەدەمی عەشیقەکەی 0شاملوا ەوە کردووە،

گوزارشیان لە خۆشەویستی ئەو داوە!

ئێمە سێ هاوڕێی سەیر بووین،

دواجار، من کە نازانم کامیان بووم،

بە هەموومان، یان بە یەکێکمانم وت:

ئای، ئێمە چەندە بچووک بووین
لەوە بچوکتر بووین نەهێڵین
درۆ سپییەکانمان
باوێشک بۆ یەکتری بدەن..
لەوە بچوکتر بووین بتوانین
سەماوات و فڕینی جەستەمان
لەسەر مێزێک کۆکەینەوە..
بە هەمووومان، یان بە یەکێکمانم وت:
بەر لە کەوتنە خوارەوەی بەردێک
بۆ ناو جامێ لە غەریزە،
بەرلەوەی تۆش
بکەویتە ناو شەمعەدانی قەسیدەوە
لە هێلانەیەکدا، کە هی خۆت نەبوو
موستەعار بوو،
سەرنجت ئەدایە زاو و زێی
ئەو بوونەوەرانەی

لە یەکتریان دەپرسی،

ئەم هەتاوە چیی لێماوەتەوە لەبەری کەین؟

ئەم ئاوێنەیە بۆ ئەوەندە زوو شکا و

تێر سەیری خۆمانمان

تێدا نەکرد؟

بە یەکتریان دەوت:

هەر (باخۆس) مابوو، کەمێ سەما و لەززەتی

لێقەرز کەین

ئەویش بێ تووڕەبوون،

بێئەوەی دوایین وەرزەکانی

وشک بوونەوەی

شەراب ببینێ،

بە کوێریی مرد!

دوا ورتە ورت کە هەر هیی

هاوڕێی سێیەم بو،

بەو ئەردەڵانییە پرچ خورماییەی بەخشی و

وەک ئەوەی پێشتر بیناسێ، عاشقانە پێی وت:

*کە هاتم، دەمێک بوو خۆر لەسەرمادا*

*فووی بە لەپ و پەنجە سڕەکانی خۆیدا دەکرد..*

*دەمێک بوو زمانی بەفری من و*

*حەرفی ڕێگاکانی جەستەی تۆ*

*لە دەفتەری هەردووکماندا شکابوون،*

*دەمێک بوو..*

*چ لێقەومانێکە ئازیز!*

*ئەو چۆلەکە خامۆشانەی، ڕۆژانێ*

*کەمانچەیان دەژەند*

*ئەمێستا قولاپ دەهاوێژنە گۆمی چاوەڕوانیی و*

*غەریبی ئێمەوە!*

*ئەو چۆلەکە خامۆشانە، نازانن بە کام*

*مەرەکەبی دڵگوشران*

*حیکایەتی تووشبوونیان بە تاعوونی*

*گەشبینیی*

بنووسنەوە!

چ لێقەومانێکە ئازیز!

ئیدی ئەمە ئەو رۆژەیە، تۆ بێباکانە

موحتاجی دڵکوشتنێکی تر دەبیت..

بێباکانە، فەنەری خەمێ دەخەیتەوە ئاسمانم!

ئیدی ئەمە رۆژێکە و،

ئەجەلی سەدەها عاشق

بەدەست ساڵەکانی تۆوە

مۆمیا دەکرێن!

ئیدی ئەمە راژەنینی کۆستێکە،

تیایدا، گەڵایەک لە پێکەنیندا

شێوەی ناچێتەوە سەر درەخت..

ئەمە رۆژگارێکە،

ئازارە وردەکان کە دیلانێ و چاوشارکێ

لەگەڵ یەکتریدا دەکەن

ئاگایان لەوە نییە، من و تۆ

چۆن پرسیارەکان لەخەو رادەکەین!

***چ لێقەومانێکە ئازیز!***

***ئێمەی سێ هاوڕێ سەیرەکە،***

***بە ترپەی دڵ، نامەمان بۆ***

***شەراب نۆشێکی ناو فارگۆنە بەتاڵەکانی***

***ژیان نووسی،***

***پێمان وت:***

***وەرە بمانکەوە بە ئادەمیی..***

***بمانخەرە سەر باڵی***

***ئەو ئێوارە ڕەنگ مۆرانەی***

***هەمووما پێکەوە،***

***لە زنەی یەک گۆرانیمان دەخواردەوە..***

***وەرە بارینمان فێر بکە..***

***بمانکەوە بە ئادەمیی!***

1998

# پاڕانەوە لە ئاو . . .

* بۆ کوشتنی ئاو خۆی.
* بـــــــــۆ هـــەمـــــــــوو تینوێتیەکان.
* بـــۆ ئێوارە نشینـــەکانی گەرمیان،
ئەو ئێوارانەی: تا نجیەکان مانیان لـــە
راکـــردن و چـــۆلەکەکانیش مانیـــان لـــە
جریوە گرتبوو.

(ئەم قەسیدەیە پێشکەشە)

**زەمەن: نیسان – ئەیلولی** 1999.
**شوێن: گەرمیان – سلێمانی – هەولێر**

*بم بەخشە ئەی ئاو.. لە دڵی تۆدا هەمیشە مێرگێک هەیە*
*پڕە لە چرا و تەنیایی،*
*پڕە لە بۆنی ئەستێرە،*
*بم بەخشە لەوەی نەمتوانی لەو مێرگەدا*
*ماڵێکی شووشەیم هەبێ لە تۆ..*
*ئەی ئاو.. بمبوورە کە لە ئیملای نوسینەوەی باراندا،*
*حەرفی دڵۆپەکانم پاش و پێش خست!*
*مەگەر نازانیت، ئەوکاتەی گوڵەکانیان*
*بە تۆمەتی ئیباحیەت چەپک کرد و*
*دامێنی میقسەڵەکانی دۆزەخیان پێ سوور کردن،*
*ئەوکات پیاوێک، دەستی گیای بە هەواوە گرتبوو،*
*ئەوکات کچێک، بە دووربین سەیری بەختی خۆی دەکرد،*
*ئەوکات چۆلەکەیەک بۆ ئەوەی شەڕانگێزیی خۆی بنوێنێ*

هیچ شەرمی لە باخچە نەدەکرد و

هەر بۆئەوەی جوگرافیای سێو بشێوێنێ

میزی بە مێژووی هەناردا ئەکرد!

ئەوکات، من و تۆش، لێورێژ بووین لە ورێنەی بەفر و

پڕبووین لە پایزی ئەو قسانەی

نەورەس لەسەر زمانی گوڵەوە

بۆ زەریای دەگێڕانەوە!

ئەو قسانە، لە دوا ورتە ورتی

مردنی بەر باران دەچوون،

وەک ئەو رستە بێدەنگ و رووتانە وابوون

تامی گلەیی موتڵەقی ئاویان ئەدا

لە هەتاوی ناو پەنجەرە تەزیوەکان..

زەریاش بە بیستنی ئەو قسانە، وشک دەبوو،

نەورەسیش باڵەکانی ئومێدی هەڵدەوەرێن:

- چونکە تۆ لە ئاوێنەدا، ناچیتەوە سەر رەگەزی ئاو و

لە شەوە سورمەچنەکانی خوادا،

لە زێوانێک دەچیت

چاوەکانی لەسەر گۆڕێک لـی جێمابێ..

یان لە خولیای گەڵایەک دەچیت

کە ناتوانێ بگاتە ئاستانەی باران،

بڕۆرەوە بۆ وڵاتی ئەو خۆرنشینە سادانەی،

- هاوارێک نەماوە، گوڵ بیکات
- گۆرانییەک نەماوە، تارژەنێ بیچڕێ
- تینوێتیەک نەماوە، چاوەڕوانی شکات بکات
- پەنجەرەیەک نەماوە، روانین ستارەی تیا بگرێ..
- پەروانەیەک نەماوە،

دەرسی عیشقی لەکن فێربین..

بڕۆرەوە و، فێر بە عیشق لەو رێبوارانە بخوازە

کە تازە لە خوازبێنی مانگ دێنەوە..

گوێ بۆ وت و وێژی بێ مەعنای

نێوان عەراِفەرەیکی غافڵگیر و،

ژنێکی عەترباز کە هەڵمی سەفەر

لە جەستەی هەڵدەستێ، رادێرە

ئەو وت و وێژانەی، پڕن لە کرداری رابووردوی تێنەپەڕ،

پڕن لە فاریزەی گومان،

پڕن لەو لێوانەی پرسیاریان لــێدەبارێ..

بڕۆرەوە و، شوێن پێی گەلایەک لە باخێکی بێ کراسدا،

لە هەڵوەریندا هەڵگرە!

بە یادی لیمۆکانەوە / وێنەی (کانیی فریشتە)

بخەرە پوولی پۆستەوە..

لەوێ/ لەو وڵاتی خۆرنشینە سادانە،

سەیری کورسییەکی بەتاڵ بکە

چاوەڕوانە، منداڵێکی لەسەر دابنیشێ و

رووە و باران

خەیاڵی ئاو لە نامەیەکدا بۆ خوا بنووسێ!

لەوێ/ تەماشای پیاوێکی بێ تەجرەبە بکە،

هێندە لە ئاییندەی ژن و پەرەسێلکە و

دڵی سوێسکە عاشقەکان رادەمێنێ،

چاوەکانی دەبن بە جووتێ فنجانی قاوە و

هەموو شەوێ/ هەتا رۆحی (ئاو)

بۆ شیعر تەرجەمە دەکات،

***ماچەکانی گوڵ پیر دەبن..***

***لە هێڵەکانی تەماسی نێوان هەردوو مەمکی نیشتماندا،***

***ئەو ملوانکە کوژراوانە هەڵدەگرێتەوە کە لەسەر رووی مسینی***

***هەریەکەیان/ جنێوێک نووسراوە:***

- ***دەرگایەک بووین/ لە سەرمان نوسرابوو/ داخراوە..***
- ***گەرەکێک بووین/ پڕبووین لە منالی کوژراو***
- ***تەرمی سپی ئەو ئاوە بووین، رەیحانەکانی عەزابیان پێ ئاو ئەدایین..***
- ***ئێمە دارستانێک درەختی شەهید بووین،***

***لەگەڵ شاخ عاتیفەمان گۆڕییەوە..***

***لەگەڵ تەم، زرەی بادە و***

***سەمای ماچ و***

***قاموسی پڕ لە بەردی سپیی***

***بەفرمان ئاڵوگۆڕکرد..***

***ئەمێستا، نە دەرگا و***

***نە گەرەک و***

***نە گێلاس و***

***تەرمی سپیی و***

نە دارستان و، نە شاخ و

نە تەم و سەما و، نە بادە..

ناچنەوە سەر هیچ بەیانییەکی ئەو ئانەشگەدانەی

تیایاندا، کۆترێک بە گمەی رەنگ و

بە حەرفی نوور دەینووسی:

ئاو.. یانی پێکەنینی میوە بۆ سەمای جاروباری رۆح..

ئاو.. یانی هەبوونی ژنێک کە هەمیشە

پەرداخە بەتاڵەکانی تەنیایی دەشکێنێ!

یانی، گوێگرتنی — با — یەک، لە نرکەی گوڵێک

کە ترسی هەڵکردنی فیراقێکی هەیە..

ئاو، لە بیرەوەریی هێلانەدا،

ئەو سێ حەرفە رووناکەی

خۆیان لە بەفر هەڵدەکێشا و

لە دۆلفینە عاشقەکانەوە فێر ببوون،

ئەوانیش بە خۆیان بڵێن:

/سەراب/ ت باش ئەی تینوێتی/

ئەی بۆشایی نێوان ئێمە و

ئەو ئێوارە زێوسییانەی

بەقەد عومری پەپوولەیەک
لەنزیک زستانێکی چۆڵەوە
ئێمە دەبووینە پێکێ شیعر و
تۆ سەراپا/ نۆشت دەکردین!
(سەراب) ت باش!
دەرگاکانی تاریکی/ بە گۆرانیی نەبێ ناکرێنەوە..!
ئاسوودە بە/ ئێستا لە منەوە، لە ئاوێنەوە فێر بوویت
ئاوی حەنان و
سێبەری خۆشەویستیت
لـێ بتکێ!
ئەمێستا/ شیعر بە شیعر،
دێمەوە لات...
گۆرانیی بە گۆرانیی،
بۆ ئەدرەسی گریانت دەگەڕێم!

* * *

لێرەوە/ بەیتێک لە بەیتە سادەکانی نیگەرانیی،

گۆرانییەک لە گۆرانییە ئەسیرەکانی ئاو،
دەست پێدەکات..
ئەم گۆرانییە هەرچەندە/ تریفەشی پۆشیوە/
هەرچەندە بە رووتیی
لەناو لمی کەنارەکانی شەرمدا/ راکشاوە،
بەڵام چون فیراقی کوکوختیەکانی بێدەنگیی
لە سنەوبەرەکانی زیندەگیی،
چون سەدای سیحراوی دەفەکانی
گریانی برادەرەکانم
لە سەندنەوەی سڵاوێکی رەشەبادا،
وەکو مردن/ لە پەرداخێ غەریبیدا،
ئەم گۆرانییە هێشتاکە
بە شەرابی نیگەرانیی دەژی و،
بە نزای کۆچ گیرۆدەیە!
ئەم بەیتە/ لە هەر ئەبەدییەتێکەوە هەڵبکات
بەسەر هەر مردنێکەوە
باسێکی خۆی، وەک سەفای فریشتەکان رابخات..
ئەم بەیتە/ مەخلوقێکە، تخووبی زەلکاوەکانی بڕیوە و

*بۆشایی ڕستەکانی ئاگری تەنیوە!*

*بەیتەوانیش/ زەردەشت ئاسا*

*کاتێ خۆڵەمێشەکەی بردەوە بۆ چیاکان/*

*قەدیسێک کە لە ئاو دەچوو/*

*پێی وت: تۆ گەرەکتە/ لەجیاتی وەی*

*ئاگر بۆ نشێوەکان ببەیتەوە،*

*بەری ئەدەیتە دڵەکان؟*

*دیارە سڵ ناکەیت لە سزای*

*ئاگر خستنەوە لەناو دڵەکاندا؟*

*ئەی بەیتەوانی بەردەرگای مەرگی ئینسان/*

*بڕۆ و*

*لە دزینی چراکان مەترسە..*

*بڕۆ و، بە کەسمان مەڵێ:*

*چەند کەس لە جامێ تاریکیدا مەلە دەکەن..*

*چەند قەڵەم/ لە تینوێتیی نووسینەوەی*

ئەم بەیتەدا خنکان/

هێندە بەسە/ بەو دەستەی لە دڵتەوە نزیکە/

ئەستێرەیەک لە ئاسمانی ئومێد بخوازیت/

هێندە بەسە/ بەو لێوانەی

کە هەمیشە پرسیاری ماچیان لێدەتکێ/

جاروبار نێرگزی ناو سەبەتەکانی مانگیان

پێ بخەیتە سەما!

ئەی بەیتەوانی بەردەم پەنجەرەیەک/

کە هەمیشە دەترسیت لەوەی،

-با- یەک لە کۆتاییەکانی غەریبییەوە هەڵبکا و

لێت بپرسێ:

تۆ، لە کوێی باریندا وەستاویت؟

ساڵی چەندەمی تینوێتی لەدایک بوویت؟

لە کام پاییزی کۆڵانەکەتاندا،

ڕۆژێک شەقامێکیان لە گەڵا

بۆ ڕۆیشتنی گالیسکەکانی بەختی کچان و

کوڕانی گەڕەک ڕاکێشا؟

هەر لەوێ/ لەو جادەیەی بە گەڵا دروستکرابوو
بە تەباشیری کام ئارەزوو
چەند هێڵێکی سپیتان بۆ قیراجی مەلەکان و/
بۆ خەتخەتێنی کەنارییە سەرەڕۆکانی روانین کێشا؟
ئەی بەیتەوانی دیوانی ئاگر/
تۆ کە دەلیلی ئەو شووشانە بوویت
رێگای سەرابیان ون کردبوو..
تۆ کە سەرقافڵەی هەموو ئەو رێواسە پیرانە بوویت
زەمین تفی کردبوونەوە ناو زەمیلەکانی خۆی..
تۆ کە پڕبوویت لە غەریبیی/
کە گۆرانییەکی ئاوارەی ئەو سەحەرە رووتانەیت،
بە دەستێک چاوەڕوانیی دروێنە دەکەن و
بە دەستەکەی تریان
خەتمی ئەو عیشقە رژاوە دەچیننەوە
کە لە شەفەقێکی شەهوانییدا

پیاوەکان خەون بە خەون

بۆ یەکتری دەگێڕنەوە،

تۆ/ کە تەفسیری شەیتانیی بوونی ئاوت پێ نەکرا،

ئیدی:

* شەرحی کەم/ یا شەرحی نەکەم

من چیرۆکی ئاوابوونی خەلیقەتێک

لەو دیو پەنجەرەی مانگەوە چاوەڕێمە..

سۆز بباریٚ/ یا نەباریٚ

قەرارە بە پێوانەی هەڵڕژانی سپێتی

لە پەیڤەکانی نوورەوە

چرایەک/ مۆمێک/ نەخێر دەنکێ شقارتە،

بە دەستی قەلەندەرێک هەڵبکرێ و

ئاخرین گۆرانیی حوزن/

پەرش بکات،

خواوەندەکان/ بەرماڵی ئاشتی رابخەن، یان نەء

ئەمێستا ئاوێنەکانمان،

سیخوڕە ئاسوودەکانمان،

باخچە خامۆش و ئاوسەکانمان بە خەونی کۆتر و/

بەردە مەست و رووتەکانمان/
بڕیارە هەموومان
کراسی خوێناوی رووبارێک/
لە پێشوازی هاتنی تینوێتیدا لەبەر بکەین..
بڕیارە بە (ئاو) بڵێین:
بگەڕێوە" زیندەگیی بەتۆوە جوانە ئەی ئاو!
کەچی ئاو دەڵێت:
تا بە عیشق خۆ نەشۆن و
تەسبیحەکانتان نەکەنەوە زوننار"
نایەمەوە!
(ئاو) بەدەم دوا ئاوڕدانەوەی خۆیەوە، دەپرسێت:
- ئێوە کامتان هەتا ئەوسەری
کەلاوەکانی عیشق چوون،
بۆئەوەی تەرمی پەپوولەیەک،
بەر لە کوشتن بۆ ماچێک دەگەڕا، بدۆزنەوە!
ئاو راست دەکات..

ئەو هەرگیز لە ئێمە ناچێت،
ئەو بۆ راوکردنی تیشکێ
بولڤار و چراخانێ/ تیرۆر ناکات..
ئاو.. نە لە پێکی سێیەمی شەوە خوار و خێچەکاندا
دەم بۆ سیاسەت دەبات و
نە لە هیستریای شەڕەکانی — با- دا
شەماڵ و باویلکە دیلەکان دەکوژێ..
ئاو.. ژنێکە
لە دەربەندی گۆرانییەوە هەڵدەکا و،
لە بەرامبەر جوانییەکانی پایزەوە" خامۆش دەبێ..
بە سادەییش/ مەوجەکانی خۆی
لە جانتای رۆژە پڕ ئاوێنەکاندا قەد ئەکات..
گوێ لە شەقژنی باڵی ئاو بگرن.. ئاو...!
* * *
دوای کۆچی ئاو.. تفەنگێکی پیر پێی وتم:
ئەوەتام، زەینی شیعرێکتم بدەرێ..
تەنیایی پێی وتم:
ئیدی لەم خەونە بەدواوە،

*ئاو و تۆ،*

*رووتبوونەوەی یەکتری لە درزی دڵۆپەکانەوە نابینن!*

*گۆزەیەک کە پڕ بوو لە سەرزەنشتی ئاو خۆی/*

*پێش ئەوەی خۆی بشکێنێ*

*پێی وتم:*

*تۆ کە خۆت و شیعرت، پڕن لە بەفری غەریبیی،*

*تۆ کە وەسفی فەسڵێک لە ڕاڕایی پەپوولەکانت پێ نەکرێ،*

*کە نەتوانیت پێناسەی رژانی بێدەنگیی،*

*بەسەر جەستەی گێلاسە تازیە بارەکاندا بکەیت/*

*کە لە مەسخەرەی تاڵانکردنی*

*خۆڵەمێش لە ئاگر و*

*لە دزینی تاجەکانی خەیاڵ لە شیعر/ بێدەنگ بیت..*

*تۆ کە لە داخی سواغدانی کەلێنەکانی رووناکیی*

*بە ژاوەژاوی بەربەرییەکان،*

*بۆت نەکرا هەموو زەمین*

*بکەیتە چاوی قەسیدەیەک/*

*تۆ...*

تۆ...

تۆ...

کە نەتتوانی..

کە بۆت نەکرا..

کە بێدەنگ بوویت..

* بۆ جارێ نایەیت بچینەوە لای منالْیی ئاو و

بچینەوە لای ئەو شەکرەسێوەی

بە سینەیەکی شووشە بەندەوە/

- وەفای باران و

- وەسوەسەی ئاو و

- مەرگی باڵندە و

- گوناهەکانی جەنگی شمشێر و

فریشتەکانی بۆ باس دەکردین..

ئەو شەکرە سێوە/ دەمەوگۆرانیی،

لە سەحەرێکی عاریفانەدا

تازە لە گەشتی زەریا و بەیانی دەگەڕایەوە..

ئەو شەکرە سێوە/ کە وشەی (ئاو) ی بە قسەی گەڵا،
دەخستە رستەی شووشەکانەوە،
هەمیشە دەیوت:
(ئاو) شاژنێکی نەزۆکی شاری غەریبەکان بوو،
هێندە جەستەی خۆی لە ئاگر خشاند،
هێندەی درۆ بیست،
هەتاکو رەحمی پڕ لە بەفری خۆی
بە عەزاب شوشت و
ئیدی هەنگوینی مەمکەکانی خۆی
بە کەس نەبەخشی..!

* * *

- ئەی ئاو..
دیسانەوە بمبەخشە،
من (زەریا نووس) نەبووم تاکو پێت بڵێم:

ئەم شیعرەش گەمەیەکی سەیرە،

وەهمی عیشق و

خەیاڵاتی پووچی لالە بە چرا و،

پێکەنینی مانگ بە رووی ئەستێرەکاندا،

فرێئەداتە دەریاوە..

ئەم شیعرە لەگەڵ خۆتدا، لەژێر وێنە سەرابیەکەی خۆتدا،

جارێکی تر، دەنووسێت:

لەوسەری ئایندە و/

پڕ بە شمشاڵی جەستە، پڕ بە گەرووی کوفر، پڕ بە زاکیرەی شەڕ،

دەنووسێت:

ئێمە کە لە عەدەم گەڕاینەوە، خودا و ئاومان پێکەوە ناشت....!

1999

*ئەم قەسیدەیە لە چوارەمین فێستیڤاڵی گەلاوێژدا، بەهاوبەشیی، پلەی یەکەمی هێنا.

# نیشتمانێك هەبوو . . .
# پڕ بوو لە باخی جێهێشتن!

**دائیم لە حەضەردا سەفەریی بە... لە وەطەندا**
**غوربەت کەش و عاجز بە، ئەگەر ئەهلی طەریقی**
**( نالی )**

**▪ بۆ حەیدەر بابان.. کە هەمیشە خەونی بە بەفرەوە ئەدی.. کەچی کە سەفەری بەرەو دورگە مەجهولەکان کرد، هەرەسی بەفری سەرسنوور، مەرگی پێ بەخشی.. چ وەفایەکی بۆی نەبوو.. ئەم دێڕە عاجزانە بۆ مەرگی ئەوە..**

لەو سنوورە بەفراوییانە

بۆشاییەک لە جوملەکانی مەرگدا هەبوو

تیا راکشایت..

زەوی یەکپارچە مردنی لێڕوابوو،

لە دڵی سپی بەردێکا،

لەو بەفرەدا، ژوورێک زەردەخەنەت هەبوو..

پەرداخەکەت پڕ بوو لە تریپەی دڵی خۆت

سەرقاڵ بووی، خەریکی نووسینەوەی عاتیفە بوویت

بە دەستێکت، نامەت بۆ زەمین ئەنووسی و

بەوی تریان، پشکۆی ناخی خۆت ئاو ئەدا..

لە نامەکەتدا بۆ زەمین، بە رەنگێکی تۆخ ئەتنووسی:

ئەگەر لەپێش تۆدا مردم

با شمشاڵی مێژووی خۆم و

رەسمی ئەو دوا پێکەنینەی، بەجێی دێڵم"

شایەتیی بۆ تەنافی ئەو مەرگە بدەن

که ساڵانی تەڕی عومرم پیا هەڵواسی..

*بەفر، ئەو باخەوانەی سەر سنوور،*

*چۆن دڵی هات*

*گوڵــێ بخاتە ئینجانەی مردنەوە!*

*سەفەر.. ئەو پەنجەرە شکاوەی"*

*چۆن جورئەتی قەرز کرد و*

*روخساری هاڕەکردووی خۆی*

*بە ئاوێنەکانی نیشتمان،*

*گۆڕییەوە!؟*

*هەمو جارێ..*

*کە سەرمان بە ژوورە بەردینەکەیدا ئەکرد،*

*خێرا پێکەنین حازربوو*

*نوکتەیەک خۆی بە هۆدەی خەما ئەکرد و*

*چیرۆکێک خۆی ئەنووسیەوە!*

*(حەیدەر) لە خەونی ژێر دارگوێزەکانی*

*عەسرانی لاوێتیشدا،*

*سیمای برادەرە قاچاخچییەکانی*

بەو بێوەفاییە نەدیبوو!

ئەو تەنیا ماڵێکی هەبوو، نیشتمانێ"

پڕ بوو لە باخی جێهێشتن..

ئەو بە عیشقێکی سەیرەوە،

نوێژی سەفەری دابەست و

کە چاوانیشی هەڵبڕی.. چیی ببینێ!

بینی گێڕانەوەی مەرگ، دوایی نایە..

ویردەکانی پڕکرد لە ئاو..

بە دەنگی بەرز، وەک بەرزی مانگ

هاواری کرد:

سبەینێی من، بێ شووشەیە،

باخچەکەم پڕە لە دەرزی،

وەسفی ئەو هەموو کوشتنە

بە من ناکرێ..

شکاندنی چرای ئەو هەموو قەڵەمە،

لەسەر حسابی تاریکیی،

بەدەم چاوەڕوانیی هاتنی پاسێکەوە،

***یان لە دانیشتنی ناو فارگۆنێکدا***

***ناخرێتە یاداشتەکانی بارانەوە!***

- ***ئێی.. بەفری ئاشنام..***

***تۆش بەر پشتێنەکەت پڕ بوو***

***لە خەنجەر و برین و خوێ..***

***پڕ بوو لە حیلەی کوژراوی ئەو ئەسپانەی***

***لەناو کراسی ئەو خوێنەی***

***کرایە بەر تریفەکانی سەرەڕێ.***

***لەناو سەربڕینی ئەو بارانەی***

***ویستی ببێتە میوانی شیعرێ"***

***ئەو ئەسپانەش، لە دەرگای سپی تۆیان دا!***

***کەچی تۆ، ئاشنایەکی چەند بێوەفا و***

***کەپرێکی چەند بەوەفا بوویت***

***بۆ حەوانەوەی عەدەمیان!***

** ***وەرە با بچینەوە لای شوبات،***

***ببینەوە میوانی مارتی دوو هەزار..***

!سالەکەی سقووتی داریوش!

بچینەوە لای ئەو سنووقی پۆستەیەی

نامەکانی پێش سەفەرت تێ فڕێدان،

لەژێر چەترێکدا لێرە بێت یاخود لەوێ

خۆ لە جنێونامەی

برادەرە بێوەفاکان بپارێزن،

لەژێر چەترێکا، لەم لەحزە تاریکەدا

وەرە پێکەوە بڕژێینە بینینەکانی دنیاوە..

ئازاری درەختە ماڵییەکانی کورد

لە چنگی قەسوەتی ئەوان دەرباز بکەین..

وەرە بە خەونێکی هێمنەوە،

خۆ لە شەرابی تووڕە بوون هەڵبکێشین..

ئەی هاوڕێکەم، ئاشنا سپییەکەی جارانم"

لە تەیمانەکانی تۆدا،

گۆرانییەک بوو بە سەهۆڵ..

داخۆ چەند عیشقی تری پڕ جاویدانیی و

سێبەری خەفەکراوی چەند کۆچیاری تر،

پرسیاری سەفەریان لە تۆدا نقوم کرد و
قامەتی ئازاری خۆیان
لەناو سپێتی تۆدا، رووت کردەوە..
* هەتا مابووم، موددەتێک بوو
من بە دوربینی حوزنەوە
دوا ئاورم
لە پەیکەری هەڵواسراوی وڵاتەکەم ئەدایەوە..
ئەموت خوایە"
لە نێوانی گۆرانیی سەفەری من و
سرووده بە بەردبووەکانی نیشتماندا
کاممان پشتمان لەوی تر کرد؟!
ئەموت خوایە"
ادە هەڵکە شەماڵی زیندەگییەک،
تاکو ئەم هەوری بێ عیشقیی و
قورِی ئەم خوێنە راماڵێ..!

ئەموت خوایە،

کەنگێ بەردی هاواری من

دێتە قسە و

نیشتمانیش، کەی ئەبێتەوە نیشتمان؟!

ئەمپرسی: بلۆی مەچەکی ئەم شەڕە

زنجیر بکرێ و

منیش بە دڵێکی شکاوەوە،

بە تەرمێکی بێ سەرەوە،

نەگەڕێمەوە لای ژنە چاوەڕێ و تەنیاکەم؟

ئەمێستاکە، من نازانم

لە ئاپۆرەی مردووەکاندا، هەر من زیندووم،

یان لەم قەفەسی ژیانەدا

هەر من گەڵایەکی مردووم؟

من نازانم،

زەمزەمی نیشتمانە لێڵ بووە،

یان دەفتەری سۆزی منە

بە خەیاڵاتی سەفەر و

*لەناو بێوەفایی بەفر،*

*لەت لەت بووە؟*

*نازانم ئەوە دڵی بچووکی منە*

*لەناو لەپی هیچ کامێاندا، خۆی ناگرێ*

*یان هەرمێییەکە، (مردن) ی ناوە و*

*تەنیا خۆمی تیا پاڵکەوتووم!*

* * *

# بڕۆن, عیشق ڕێگەتان بێ!

*** چەند سکێچێکە بە ڕەنگی ئاو.. بـۆ هاوڕێیـانم یاســینی فــەقێ ســەعی و دلاوەر قـــەرەداغی، لەهەرکوێیەکی غەریبیدا ڕاوەستابن***

*لەگەڵ بێداری بدوێن،*

*هێشووی قسە خۆشەکان بە ڕەنگی ئاو بنووسنەوە!*

*گەڵای نوکتەیەک بە درەختی ژیانەوە بۆن کەن*

*باشترە لە ژماردنی ئەو نامە سپیانەی*

*زەمەنی شمشێر بواری نەدا بە ئێوە بگەن!*

*حیکمەتی ئێوە بوو، فەزایەک لە غەریبی پڕکەن*

*لە بیرەوەرییەکانی ئێرەی کورد و*

*لە تەنیایی ئەو ماڵانەی*

*کەوتوونەتە دەرەوەی سنووری دڵنیابوون!*

*بڕۆن، لەو شوێنەدا کە سەفەر دەبێتە وەسوەسەیەکی تر و*

*لەو دۆزەخە جوانەدا*

*کە دەبێت لەسەری ساڵانەوە و*

لە منداڵیەکی بێهودەوە، مێژووی گەنم بنووسنەوە!

لەو شوێنەدا کە نازانم کوێی غەریبییە

هەریەکەتان بە پەرداخێکەوە دەبینم

خاڵیی لە ماچ و

پڕ لە ئاوا بوون،

دەتانبینم، سەرو خواری جوگرافیای قەدەر دەگەڕێن

بۆئەوەی ئاوێنەیەک بدۆزنەوە

بەیانییە تەڕەکانی دڵنیایی تیا ببینن،

بۆئەوەی لە خۆتان بڕوانن

هەریەکەتان بە دوو باڵی وەک بەختی نیشتمان، شکاوەوە،

دەچنەوە سەر میحنەتی خێڵی ئەو ئەستێرانەی

کە هەتیوترین هەتیوی دنیان،

ئەو ئەستێرانە چەند سکێچێکن

بە ڕەنگی کورد رەسم کراون...

بڕۆن.. سەفەر دەستی منداڵێکی بزێو بوو

ئێوەی دەنکە هەناری دڵی هەڵوەراند،

ئێستا بە باخچەیەکی بێ هەنارەوە

بە دەمامکێکەوە کە هیی خۆم نییە، هی شیعرە

لە هەموو ئێوارەیەکی خوادا

پێشوازی لە زاهیدێک دەکەم

کە دەستەکانی پڕن لە تریفەی ماڵئاوایی،

روخساریشی پڕە لە بێ میزاجی ئێوە!

ئێوە لەم گەمەی (دەست بە غەریبی) یەدا [*]

لەبیرتان چوو

یەک دوو هاوڕێی خوێن رژاوی خۆتان

لەسەر بکەن...

ئێوە و من، هیچ حەرفێکمان

لەناو ئەبجەدیەتی گوڵەکاندا نەمابوو،

شەڕەکان هێندە زۆر بوون، بە ئێمە نەدەکران

هودنەکان، فرسەخ بە فرسەخ لەگەڵ (مەحوی) دا

بەپیری مەرگەوە دەچوون...

زێوانەکان، هێندە دەوروپشتی گۆڕەکانیان خاوێن کردەوە و
مردووەکان بەیانی باشێکیان لـێنەکردن،
ئیدی ئەوانیش، لە تابوتی سەفەردا ڕاکشان...
ئەمێستا، قفڵەکانی سۆز، باس لە نیگەرانییان ناکرێ
چونکە کلیلــێ نییە دڵیان بکاتەوە..
بڕۆن، عیشق ڕێگەی هەمیشەییتان بێ
بڕۆن، ئەی وەکو شیعر غەریب و
ئەی وەکو خۆم تەنیاکان..
بڕۆن، قاسیدێک پەیدا دەبێ
بۆنی تەنیایی ئێوەم بۆ بێنێ،
بڕۆن، شەوێکی تری سوورمەچن لەم سەلیمی ڕۆحە دادێ
جانتای خەونەکانتان بکاتە کۆڵ...
بڕۆن، دوای ڕۆیشتنی ئێوەش
شەڕی گومانەکانی بەرد
لەگەڵ پرسیارەکانی شەڕابدا،

*بەردەوامە...*

*برۆن، لەم بەرەبەیانەدا، بەڵکو نزای ئەم شیعرە بگاتە*

*ئاسمان،*

*بەڵکو ئەستێرەیەک*

*لە شەوی دنیا جێبمێنێ و*

*بۆ کورد بگری...*

*برۆن.. عیشق ڕێگەتان بێ...!*

(*) (گەمەی دەست بە غەریبی): تەوزیفی (دەست بەدیوار) ی منداڵانە.

# نەفرەتی مارگریتا . . .
## یان بەشێك لە :
# کتێبی خەڵوەت!

بەدیار کام سونبولی برینەوە، مارگریتا!

دەستەکانت پڕ پڕ دەکەیت لە گلەیی..

بەدیار کام گومانی فاشیلەوە، مارگریتا!

لە مەراقی من دەڕوانیت..

کە تۆ شووشە عەترەکەی خوات شکاند،

گێلانە، فێری خواردنی سێوت کردم،

من لەمێژ بوو لەخۆم دەچووم

بۆ ڕێکردن بە کۆڵانی تریفەدا،

سەبەتەیەک پەلکەزێڕینە و رووناکییم، سەرو زیاد بوو!

لە ئاخرین نزادا، کە گۆرانیم لێدەچۆڕا
بەدەم ڕاکشانەوە لە سێبەرە شکاوەکانی ئاودا
ڕووبار مەرەکەبی قەسیدەم بوو،
وەک باران، بەدیارخەمی هەڵوەرینەوە
وەک ئازاری ناو شمشاڵ، بەدەم جیلوەی ژەنینەوە
وەک هەتاوێکی ناو ئەنفال، بەدیار سەحرای برینەوە،
بەشێک لە دڵم ئاوا بوو،
بەشەکەی تریشی کەوتە بەر دەنووکی مەلێک
کە لە ژیان هەڵاتبوو..
ئەو مەلە، خۆی لە نزاکانم وەرئەدا و
پێش ئەوەی لەتەکەی دڵم، بخاتە ژێر باڵی چەپی،
پێی دەوتم:
+ ئاخر عیشق دۆستیی خۆت بوو، وای کرد"
حەرفی یەکەمینی گورگ و
دوایەمین حەرفی – تفەنگ- یش،

وەکو گێلاس بخوێنیەوە..

تۆ بە اسولەیمان) ت دەوت:

لە زمانی هەموو تەیرەکانی دنیا دەگەیت

کەچی مەحاڵە بزانیت"

پەپوولە، لەکاتی سەمادا"

لە دڵی خۆیدا چیی دەڵێ!

نەمزانی ئەو مەلە، کە لە ژیان هەڵاتبوو،

لە کوێی ئازارەوە،

لە باشوور یان باکوورەوە هەڵفڕیوە و،

دەیەوێ بە چناری کام مەرگەوە

هەڵبنیشێ!

دەیویست بڵێ:

تەریقەتێک هیی گوڵ و ئاو و سەحەری عاشقان بێ و

بچێتەوە سەر زەوقی خوێن!

شووشەیەک پڕبێت لە عەزابە ڕەنگینەکانی هابیل و

بە بەردی گومانێ، بخرێتە سەر مەیلی هاڕەکردن!

دەلیلێک باوەشێ لەو شەونمانەی هەڵگرتبێ

کە دەبنە کچی شەرعیی گەڵاکان

کەچی بتباتەوە سەر شلوێ بوون..

ئیتر چۆن، لە غەزەلی نێوان پەنجە و،

هێشووە ترێکانی ئەویندا

گەمەی خوێنی شمشێر و ڕووناکیی، گەرم نابێت!

ئیتر چۆن، ئاخر چۆن مارگریتا!

تەبیعەتی گوڵ تێک ناچێ و

نەسیمی ژیان و

نارنجەکانی عیشق و

میمەکانی ماچ،

ناگەڕێنەوە ناو کتێبی خەڵوەت!

ئەو مەلە.. مارگریتا! ئەو مەلە"

لە قسە وباسی قەراغ شەڕەکانەوە هەڵاتبوو

حەزی نەدەکرد لەبەر پەنجەرەیەکدا بمرێ

بە ڕووی مانگدا داخرابێ و

روانین تیایدا، کوێر کرابێ!

مارگریتا! ئەو مەلە خەڵکی باران بوو،

بە سادەیی پێی دەوتم:

+ تۆ رۆژگارێ،

کە سەرابی هاورێ جۆراوجۆرەکانت

بە خەم و کەسەر و نیگەرانیی، تەڵخ دەبوو..

تۆ دڵت پێ دەبەخشین و،

بەو هەموو مەراقە جوانەی خۆتەوە

سەبووری و دڵدانەوەی ئەوانت

دەخستە لیستی شەکەتیی و

هیلاکییەکانی شەوانتەوە..

وەک مۆمێکی تەنیا،

کە قەلەقی کوژانەوەی خۆی

لەناو رەشەبادا دەچێنێ،

دەبوایە ئێواران، بەدیار سەوسەنی خەمی ئەوانەوە

مات بیت..

ئازاری ئەوان، بێدارییان،

لە نووسینەوەی (وەزیفەی ماڵەوە) ی قوتابییەک دەچوو..
هەربۆئەوەی ئاتەشگەدەی دنیای ئەوان
بێ نوور نەبێت،
گۆزەکانی زیندەگییان،
لێوان لێو بن لە ئاسوودەیی و
بەسەر شانی ساقییە بێمروەتەکانەوە نەشکێن!
هەر بۆئەوەی نەخوازن،
لەم نیگاری بێهودەییە، بەیەکجاری بێنە دەرێ و
بگەڕێنەوە نێو رەحمی دایکیان!
تۆ، قسەت بۆ ئەسپێک بکردایە
کە دەمی پڕ بوو لە گیای مۆسیقا،
باشتر بوو لەوەی
هاوڕێی ئەو گورگە دوو پێ و
چاو و گوێ زیتانە بیت"
کە دەمامکی مانگیان پۆشیبوو،
گیرفانیان، دەمیان، دڵیان،

سەراپایان

پڕ بوو لە سادییەتی خۆیان و

لەجیاتی ئەوەی خۆیان لە — نووری بادە — هەڵکێشن،

یان پەیژەیەک لە رووناکیی

بۆ سەرکەوتن بە بەژنی زراڤی ئەویندا

بەپێوە رابگرن،

لەجیاتی ئەوە، قسەکانیان

نرخی رستەکانی سەر گۆڕێکیشیان نەبێ و

دڵیان پڕ بێت لە گۆڕستانی بە کۆمەڵ!

هەر لە خۆڕا، شەڕ بە پرتەقاڵ بفرۆشن..

مارگریتا! ئەی دۆستی جارانی شیعر و

میوانی ئێستای مەزاتخانەکانی قسە..

لەو هەرا و زەنایەدا، کە شەڕی چاوەڕوان نەکراوی

برادەرانم هەڵیان گیرساند و

منی تێدا کوژرام"

لەو شەڕەدا،

هات و هاواری ئەوەم بوو پێیان بڵێم:

شەڕی پادشاکان بوو، ئێمەی کردە بەشێک
لە جوگرافیای برسێتی
ئیتر بۆچی یەکتر بخۆین؟
بۆ دەبێ هەمیشە،
پەرداخی لەززەت لەو ئازارە بخۆینەوە
کە عاتیفەی یەکتری پێ تەڕ دەکەین و
خەریتەی برینێک لەسەر شعوری یەکتر بکێشین
کە برینی خۆمان نییە و
لە پەرژینی جەنگەکانی ترەوە
فڕێ دراوەتە حەوشە و باخیماڵی ئێمەوە؟!
مارگریتا! هات و هاواری ئەوەم بوو، پێیان بڵێم:
ئاخر کەی عیشق بە ئاگری ئێمە سووتاوە و
ئاسمانی ئێمە، کوا ئەو ئاسمانەیە
ئەستێرەکانی بەگریانەوە،
تێدا مۆمیا بکەین؟!

ناکرێ کریستاڵەکانی دەروون،

بخەینە بەر شەوقی مەرگدۆستیی و

لەبری پیاسەکردن بەناوی خەیاڵی سنەوبەرێکدا

مەرگی یەکتری بخەینە امەزاتێکی ئاشکراوەا..

ئێوە بیرتانە، ئەوکاتەی ئێمە شیعرمان ناسی،

زمانی خۆشەویستیمان گرت و

تەوقەمان لەگەڵ قەڵەمدا کرد"

کێڵگەی وتن پڕ نەببوو لە قسەی رەش!

زمان نەببوو بە گوێزان!

ئا.. بیرتانە.. دڵمان بە بۆنی گڵی بەر باران

دەگۆڕپەوە

پێکەوە وشەی امەرجانا مان لە رستەیەکدا بەکاردێنا

ماسییەکان بەئاسانیی راڤەیان دەکرد و

کەناریان لــێ پڕدەکردین لە گۆرانیی!

بیرتانە، ئەو دەمانە"

کەسمان بەوی تری نەدەوت:

قسەکانت بۆنی دووکەڵیان لێوەدێ..

***ئەو دەمانە، عیشقمان لە سەدەفی شیعردا،***
***هەڵدەگرت..***
***پایز وتنی خۆی هەبوو..***
***کەس ئامادە نەبوو بە گەڵا بڵێ" تۆ مردوویت..***
***سڵاوکردن لە یەکتری،***
***جوانیی پشکوتنی ماچێکی هەبوو..***
***وانەبوو.. مارگریتا.. وەک ئێستا نەبوو***
***بەلەمێکی پڕ لە سڵاو***
***بە قولاپی ژەنگاویی راوچییەک،***
***بە تۆڕی حەقارەتی ئەو،***
***نغرۆ ببێت!***
***وانەبوو.. وەک ئێستا***
***قاچمان لە دەرەوەی خۆماندا،***
***درۆ لەگەڵ رۆیشتن بکا..***
***مارگریتا! ئەم قسە غەریبانەی من***

ڕەنگە لە یاقووتی کۆن بچن لەلای تۆ..

بەڵام ئەز، بە دزی پاسەوانەکانی مەرگەوە،

لەودیو تەماشای زێوانەکانەوە،

کتێبی خەڵوەت" بە قەڵەمێک

پاش ئەوەی لە چاومی هەڵدەکێشم

دەنووسمەوە..

ئەم کتێبە، ائەگەرچی شەوی ساقییانیش

درەنگ بێت!

ئەگەرچی بادەکانیش،

لە نۆش کردن بێزار بووبن..

بەڵام ئەناناسی عیشقێکی نەرم پێنۆش دەکا و

ناهێڵێ، ئەو دەستە لەرزۆکانە

لە دەرگا بدەن

کە دەیانەوێت بەزۆر.. هەر بەزۆر،

بەکارەتی جوانیی شەق بکەن!

کتێبی، وەکو نەی،

ئەم خەمە وەک خۆی،

وەك سپێتی هەنسکەکانی — پوشکین — و
وەك لێدانی دڵی منداڵێ، بژەنێت!
مارگریتا! ئەی چۆلەکە رەوەندەکەی
بەر زریانی یەئس و نەفرەت،
بەگومانم ئەوە تۆ بیت،
چەقۆیەك لەدڵتا بێت و
بەقەڵەمی غەدرەوە
لاپەڕە سپییەکانی عومرێك لە فرمێسك و جوانیی،
داگیر بکەیت..
چونکە من دڵنیا نەبووم، دەمبەیتەوە لای نەوڕەسێك
پێشتر شەڕی مان و نەمانی لەگەڵ دەریا نەکردبێ،
دڵنیا نەبووم، باخی ئاگرێکم نیشان ئەدەیت
پەرژینی لە پەڕ و باڵی کۆترە مێینەکان
بۆ نەکرابێت!
تکایە.. مارگریتا..

دوا دانیشتنی ساردی نێوانمان

بە قاوەیەک، رەسمی خاچێکی تێدا بێ،

گەرم کەوە..

قاوەیەک، پێشتر بەختی چ قەرەج و

مەستێکی تری

پێنەگیرابێتەوە" مارگریتا!

ئەرجومەندم!

قسە ماکیاژکراوەکانت

نەخەیتەوە ژێر ئیعرابکردنی غەریبێکی تر و

ئەرجومەندم،

زەمەنێک هەبوو، لە کەفی سەر دەریا دەچوو

بخەیتەوە ناو جانتای گومانەکانی خۆت و

قسەو باسەکانی منیش کە شۆخترین کچی زەمان بوون

شۆستەیەک نەبوون بۆ سواڵی خۆشەویستیی

هەتاکو تۆ پشوویەکیان تیا بدەیت و

دواتر، چڵێک لە سادەیی خۆم

درەختێکیش لە شیعر و دڵ، ببڕێتەوە!

مارگریتا!

امن) ێک هەبوو دەیویست،

ئەگەر هەموو شتەکانیش بمرن،

سروشتیش لە گیتار ژەنین بکەوێ،

بەدیار قیامەتی کەونەوە، شیعرێک هەبێت نەخەوێ!

جوانییەک هەبێت،

لە ماڵی خلوددا، نەمرێ!

ائەوایێک هەبوو، دەیویست:

مەعبەدە رووخاوەکەی تۆ بکاتە گوڵجار!

زستانێک کە بە خۆی و ژاڵە ساردەکانیەوە

رەق هەڵات،

بکاتەوە هاورێی بەفر!

مارگریتا!

دڵنەواییەکانی تۆ، لە تۆپەڵە لمی بیابان دەچوون،

***شەوێک لێرە و، سبەی لەوێ..***

***لێگەڕێ.. ئەم کتێبی خەڵوەتە***

***لە بەرگەوە بۆ بەرگ،***

***بە ئاوێ،***

***ئاوی نەفرەتە، بنووسمەوە مارگریتا!***

* * *

# هەڵەبجە .. هەمیشە هەڵەبجە!

***هەموو وەرزێکی خوێناویی،***

***بەدەم شنەی گریاناویی مارتەوە***

***شەهیدێکی بزروگ، بزورگ بەقەد خەمی زەمین***

***دەبێتە میوانی ئێمە و***

***چرای ژانێک بەدڵمانا هەڵدەواسێ..***

***هەموو ساڵێک، لە ناوەڕاستی مارتەوە***

***دێیتەوە لام،***

***باسی چەلەنگیی خۆت دەکەیت:***

- ***امن هەڵەبجەم،***

***چامەیەکی تەواو نەکراوی مەولەوی و***

فرمێسکێکی ورد نەکراوەی شارەزوورم).

هەموو ساڵێ، سیروان دەرژێتە خوێنتەوە و

بەدەم هۆرەوە پێت دەڵێ:

+ بدوێ.. ئەی ژنە میهرەبانەکەی

سەر عەرشی شەهید بوون، بدوێ..

لە زمانی تریفەیەکی کوژراوەوە، لێم بپرسە:

ئەم وڵاتە لە چ گەشتێکی خوێناوی و

لەباوەشی کام خورافاتی مێژوودا،

راکشاوە؟

بدوێ، تا بەسەر مەرگا نەکەوتووم،

بە زمانی شەهادەت بدوێ..

ئەی درێژترین سەرەتا،

ئەی خۆڵەمێشیی ترین رێگا،

ئەی ماندووترین شەهید،

وەک ئاو، بدوێ!

ببینە.. بە نیگاکانی پێش ئاوابوونی رۆح، ببینە..

گوڵی سەرنجێ، لە ساراکانی تەنیاییم بگرە..

پێش ئەوەی روانین،

خۆی لەبەر گوماندا هەڵبخات،

بچۆرە بەردەم ئاوێنەی سۆراخ و

ماناکان تف کەرەوە و

سنجاقێ بدە لە یەخەی چاوەڕوانیی و

رازە نەوتراوەکان

بە چڵی بێباکییدا هەڵواسە و

بە دیواری سیاسەتەوە

دروشمێک بۆ میحنەت بنووسەوە..

دروشمێک، پڕبێت لە نزا:

○ خودایا!

کەی ئەمە روخساری منە!

خودایا!

کەی چاوەکانم لە سەفەری کوێربوون دێنەوە،

کەی دەبمەوە بە (هەڵەبجە)!

خودایا!

من دەموت: ڕەنگە مووی لــێ بێ ئەو زمانەی،

ڕەنگە هەڵوەرن ئەو پەنجانەی،

گوڵشەنی منی هەڵەبجەیان

بە دەردی گوڵخەنی دۆزەخ برد!

ئەی میهرەبانترین شەهید،

من، مات بوونی تۆ لە دەفتەری

گۆڕهەڵکەنێکدا دەخوێنمەوە،

بەرلەوەی تەرمە زویرەکان بشارێتەوە

دەیپرسی:

- ئێوە، کامتان هەڵەبجەن؟

- هەڵەبجە، کامتانن؟

○ ئێمە تەنها یەک هەڵەبجە و

بە هەمووومان، بەتەنها یەک دڵمان هەبوو،

کاتێ کوژرا،

***وەکو ئەسپێک خۆی گلابێت،***

***نەک سوارەکەی“***

***بەجێمان هێشت!***

***بدوێ ئەی ماندووترین شەهید،***

***ئەی میهرەبانترین ژنی کوژراو،***

***وەک ئاو.. وەکو ئازار، بدوێ!***

**سەرنج:**

رەشنووسی ئەم شیعرەم بەناونیشانێکی ترەوە، لە ژمارە (13)ی 1998/3/19 ی رۆژنامەی (ژیانەوە)دا بڵاوکردۆتەوە، بەڵام پاش دەستکاریکردن، لێرەدا بەناونیشانێکی تر بڵاوبۆتەوە.